وتاری پازده

زنجیره وتاری (شیرك و شیركی گوێڕایەڵی كردن)

# الشرك وشرك الطاعة

## الديمـــقراطية - الـــركن الثاني: حـــرية الرأي

## دیموكراسی - كۆڵەكەی دووەم: ئازادی ڕادەربڕین


شێخی موجاهید

تقبله الله

أبو علي الأنباري



وەرگێڕان و ئامادەكردنی

پێگەی ڕاستەڕێ






پێگەی ڕاستەڕێ

بسم الله الرحمن الرحيم

وتاری

شێخ ئەبی عەلی ئەنباری - تقبه الله-

وتاری (پازدە)

بەناونیشانی

ديموكراسی - كۆڵەكەی دووەم: ئازادی ڕادەربڕین

وەرگێڕانی

پێگەی ڕاستەڕێ



الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله
خوایە حەقمان بە حەق پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر شوێنکەوتنی، وە باتڵیشیمان بە باتڵ پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر ئەوەی لێی دووربکەوینەوە، خوایە ئەوەمان فێر بکە کە سوودمان پێدەگەیەنێت و سوودمەندمان بکە بەوەی فێرمان دەکەیت، پەروەردگارا لەوانەمان بکەیت کە کار بە زانستەکەیان دەکەن، خوایە زانستەکەمان بکە بە بەڵگە و حوججە بۆمان ئەو ڕۆژەی بە دیدارت دەگەین و نەیکەیتە بەڵگە بەسەرمانەوە ئەی چاکترینی بە بەزەییان، ئەی پەروەردگارم سینەم ئاسوودە و گوشاد بکە و کاروبار و هەوڵ وکۆششم بۆ ئاسان بکە و گرێی زمانم بکەرەوە و زمانم گۆیا و پاراو بکە تا لە گوفتارم تێبگەن، پەروەردگارا کردەوەکانم چاك بکە و تەنها بۆ ڕەزامەندی تۆ بێت و هیچ بەشێکی تێدا نەبێت بۆ هیچ یەکێك لە دروستکراوانت، لە پاشاندا:
لە فەزڵ و بەخششی الله تعالی لە دیداری پێشوو باسی دیموکراسی و کۆڵەکەکانی دیموکراسیمان کرد، وە تەواو بووین لە کۆڵەکەی یەکەم لە کۆڵەکەکانی دیموکراسی "ئازادی بیروباوەڕ و دین"، وە باسی دەستورمان کرد و باسی ئەوەمان کرد کە کێ بانگەواز دەکات بۆ ئازادی بیروباوەڕ و ئازادی دین، وە ئاماژەمان دا بەو بەڵگانەی دەیهێننەوە لەسەر ئەمە، فەرموودەی الله تعالی (**لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ**) و فەرموودەی الله تعالی (**لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ**)، وە زانیت بەدڵنیاییەوە فەرموودەی الله عز وجل (**لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ**) هیچ پەیوەندیێکی نیە بە ئازادی بیروباوەڕ و ئازادی دینەکان، سەبارەت بە (**لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ**) ئەوا تایبەتە بە خاوەن پەڕتوکەکان بەو ڕێکخەرانەی باسمان کرد کە لە لای ئەهلی سوننە و جەماعە هەیە لە ڕێگەی (الشروط العُمَرية).
ئەمڕۆش بە ئیزنی الله تعالی تاوتوێی کۆڵەکەی دووەم دەکەین لە کۆڵەکەکانی دیموکراسی "ئازادی ڕادەربڕین" جا پشتیوان بە الله عز وجل دەڵێم:
ئازادی ڕادەربڕین لە چەمکی دیموکراسی و لە ڕژێمی دیموکراسی واتە چیت بوێت بیڵێی و چیت بوێت بینوسی و چیت بوێت بڵاوی بکەیتەوە، واتە هەر شتێك بە ناختدا بێت ئەوا قانون ڕێگەت پێدەدات بەبێ بەستنەوەی بە شتێك کە ناوی دین بێت، جا هەر دینێك بێت نە دینی ئیسلامی و نە جگە لەویش لە دینەکان نابێتە کۆسپ لەبەردەم پەیڕەوکردنی ئازادی ڕادەربڕین لە وڵاتانی دیموکراسی، بۆیە هەر قسەیەکی بوێت دەیکات جا یەکبگرێتەوە لەگەڵ دین یان پێچەوانەی بێت، یان قسە بە دین بڵێت، بابەتەکەی بەلاوە گرنگ نیە، گرنگ ئەوەیە گوزارشت بکات لە ڕا و بۆچوونی خۆی بەوەی دەیبینێت، لە هەر هۆکارێك لە هۆکارەکانی ڕاگەیاندن، جا لە دانیشتنەکان بێت یان لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن یان لە ڕۆژنامە یان لە چاپخانە گرنگ نیە بەلایەوە، ئەمە بابەتی یەکەم سەبارەت بە ئازادی ڕادەربڕین، جا لە ڕێگەی ئازادی ڕادەربڕین ڕاستەوخۆ لە دین دەدەن؛ چونکە ئینسان ئەگەر زانی لێی ناپرسرێتەوە لەسەر ئەوەی دەیڵێت دەربارەی دین، ئەوا هیچ شتێك نیە قەدەغەی بکات لەوەی هەرچی بوێت بیڵێت،

بەمەش هەندێك هۆکار یان نووسین یان لێدوانی ڕاستەوخۆ دێتە کایەوە بۆ نەهێشتنی دین، -ئازادی ڕادەربڕین- ئەمە یەکێك لە ئامانجەکانیەتی، ڕێگای دووەم بۆ ڕزگاربوون لە دینەکان لە ڕێگەی ئازادی ڕادەربڕین: کردنەوەی بوارە لەبەردەم هەموو بیروباوەڕێك، وەك شیوعیەت و عەلمانیەت و نەتەوەپەرستی و ئەو حیزبانەی کە وڵاتانی موسڵمانانی لێ پڕبووە، کەوایە لە ڕێگەی ئازادی ڕادەربڕین ڕاستەوخۆ لە دین دەدەن، بە هەمان شێوە لە دین دەدەن لە ڕێگەی کردنەوەی بوار بۆ بیروباوەڕە کوفریی و عەلمانییەکان بەوەی بوونیان هەبێت، وە هەندێك هۆکاریان هەبێت بەهۆیانەوە بانگەشە بکەن بۆ بیروباوەڕەکانیان، ئەمەش بابەتی یەکەم بوو کە پەیوەستە بە ئازادی ڕادەربڕین.

بابەتی دووەم: لە ڕێگەی ئازادی ڕادەربڕین کار دەکەن لەسەر تێکدانی هەر شتێك پەیوەندی هەبێت بە ئەخڵاق، جا ئەخڵاق تێکدەدرێت لە ڕێگەی دیموکراسی بە کارکردن بە ئازادی ڕادەربڕین، بۆیە دەبینی ئەو خەڵکانەی لە وڵاتانی دیموکراسی دەژین بۆیان هەیە هەر شتێکیان بوێت بڵاوی بکەنەوە، جا ئەخڵاق تێکبدات یان زیان بە ئەخڵاق بگەیەنێت یان ئەخڵاق نەهێڵێت، لێپرسینەوە ناکەن لەسەر ئەمە.

دێینە سەر وردەکارییەکە لە وڵاتانی دیموکراسی، وە ئازادی ڕادەربڕین گەیاندوونی بە کوێ تاوەکو لە ڕێگەیەوە بزانی بۆچی دیموکراسییان بۆ ئێمە دەوێت؟ وە بۆچی پێویستە ئازادی ڕادەربڕین هەبێت لە لامان؟

لە بەریتانیا پیاوێك کە ناوی "سەلمان ڕوشدی" بوو -بە ڕەچەڵەك ئێرانی- پەڕتوکێکی بڵاو کردەوە، لە بەریتانیا ژیا و گەورە بوو و لە زانکۆکانیان خوێندی، پەڕتوکێکی نووسی لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو ناوی نا "الآيات الشيطانية" ئایا دەزانی باسی کێ دەکات؟ باسی پێغەمبەر ﷺ و دایکانی ئیمانداران دەکات، موسڵمانان لەو کاتدا دەرچوون بە خۆپیشاندان و ئیدانەکردن و ئەم شتانە، الله پاداشتیان بداتەوە ئەوانەیان کە نیەتی بۆ الله عز وجل بووە، لەو نێوەشدا "خومەینی" ئەم ڕافیضییە پیسە، سەرۆکی کۆماری ئێران بوو کە بەدرۆ پێی دەوترێت ئیسلامی، ئەم کابرایە کاتێك هەواڵی ئەم پەڕتوکەی زانی و موسڵمانانیش هەڵساون بە نکوڵی کردن لەم پەڕتوکە بە خۆپیشاندان و ئەو شتانە، ناچار بوو قسەیەك بکات دەربارەی ئەم "سەلمان ڕوشدی"-یە و پەڕتوکەکەی، جا فەتوایەکی دەرکرد وتی: "لەسەر هەموو موسڵمانان لە جیهان پێویستە کار بکەن لەسەر جێبەجێکردنی حوکمی کوشتن لەسەر نووسەری پەڕتوکەکە و بڵاوکەرەوەکانی -ئەمە دەقی فەتواکەیەتی- ئەگەر ئاگاداری ناوەڕۆکەکەی بووبن، وە هەر کەسێك شوێنی ئەو کەسە دەزانێت و ناتوانێت بیکوژێت، ئەوا پێویستە بە کەسێك بڵێت کە دەتوانێت بیکوژێت، بۆ ئەوەی هیچ کەسێك نەوێرێت قسە بە پیرۆزییەکانی موسڵمانان بڵێت" وە هەروەها لە پاشکۆکانی فەتواکە هاتووە: کە هەر کەسێك لەم ڕێگەیە بکوژرێت ئەوا شەهیدە بە ئیزنی الله، هۆکاری بەستنەوەی سەلمان ڕوشدی بە خومەینی، بۆ ئەوەی بزانیت مانای ئازادی ڕادەربڕین چییە، لە سەرەتادا موسڵمانان ئەوانەی نازانن مانای ڕافیضی چییە، زۆر بە خومەینی هەڵخەڵەتابوون و وایاندەزانی پارێزەری دین و پیرۆزییەکانە و هەر ئەوە بەرگری دەکات و هەر ئەوە حوکمی کوشتنی دەرکرد و هەموو

دەسەڵاتدارانی عەرەب بێدەنگن و هیچ جوڵەیەكیان نەكرد، هەر تەنها خومەینییە ئەنجام دەدات و قسە دەكات، ئەوە بزانن كە خومەینی كاتێك ئەم فەتوایەی دا لەسەر بنەمای تەقییە بوو، لەبەر خۆشویستنی دین و ڕق بوونەوە لە سەلمان ڕوشدی نەبوو چونكە سەلمان ڕوشدی ئەگەر قسەی وتوە بە دایكمان عائیشە و حەفصە و خەدیجە، ئەوا ئەوانیش قسە دەڵێن بە دایكانمان زۆر زیاتریش لە سەلمان ڕوشدی، لە لای ئەوان دایكمان عائیشە تۆمەتبارە بە زینا! ئەم پاكە، وە بەهۆی ئازادی ڕادەربڕین لە كەناڵەكان ئەمە دەڵێن، یەكێكیان وتی: "من وتم زینای كردووە و ئینجا قسەیان كردووە دەربارەم، من نەموتوە ئەو زینای كردووە كاتێك پێغەمبەر لە ژیاندا بووە، نەخێر بەڵكو لە دوای مردنی پێغەمبەر كردوویەتی"، ئایا دەزانی لە كارەكانی مەهدیەكەیان كە هیچ بوونێكی نیە چییە؟ ئەم مەهدیەی دەڵێن الله بەزوویی دەریبخات، وە لە پەڕتوكەكانیان دەنوسن "عج"، لە پێشەكی كارەكانی ئەوەیە كە موسڵمانان دەكوژێت لە حەڕەم، وە دایكمان عائیشە دەردەهێنێت لە گۆڕەكەیدا و حەددی زینای لەسەر جێبەجێ دەكات! كەوایە چی شتێك خومەینی توڕە كرد؟ ئەمە ئەو مەهدیەیە كە چاوەڕوانی دەكەیت، ئەمەیە كە ئەنجامی دەدات، جا ئەگەر سەلمان ڕوشدی هەندێك قسەی كردووە لەسەر دایكمان عائیشە، چی بێزارت دەكات؟ مەهدییە مەعصومەكەت چەند هێندەی ئەم كابرایە دەكات، وە تۆش باوەڕت پێیەتی و باوەڕت بەوەیە كە دەیكات، بۆیە لێرەوە دەردەكەوێت كە ئەم پیاوە ئەم فەتوایەی تەنها وەك تەقییەیەك دەركردووە.

هۆكارێكی تر لەوەی كە ئەم فەتوایە تەقییەیە، لەبەرئەوەی موسڵمانان دژی ئەم كارە وەستانەوە بۆیە ئەویش نابێت بێدەنگ بێت لە كاتێكدا بانگەشەی ئەوە دەكات سەرۆكی دەوڵەتێكی ئیسلامییە، كەوایە تەقییە كردن لە لایەك و ئەو بارەی تێیدا بوو هانی دا بۆ دەركردنی ئەم فەتوایە، چۆن دەیسەلمێنی ئەم فەتوایە بناغەكەی تەقییەیە؟ ئەگەر خومەینی لە حوسەینییەك لە حوسەینییەكان بوایە و ئەم فەتوایەشی دابوایە ئەوە خاوەن عوزر دەبوو، دەوترا كابرا سەرقاڵە بە (خومس و موتعە) و دەرفەتی ئەوەی نیە تاوەكو بچێت ئەم پیاوە بكوژێت، وە حكومەتەكانیش گوێ ناگرن بۆ قسەكانی، نەخێر، كاتێك ئەم فەتوایەی دا سەرۆكی دەوڵەتێك بوو، وەزارەتی بەرگری هەبوو و وەزارەتی ناوەخۆی هەبوو و هەواڵگری هەبوو و سوپایەكی هەبوو كە جەنگی بەعسییەكانی كرد بۆ ماوەی هەشت ساڵ، لەو هەموو ملیۆنانە نەیدەتوانی پیاوێك هەڵبژێرێت و بینێرێتە بەریتانیا بۆ ئەوەی ئەم كابرایە بكوژێت، كە شوێنكەوتووانیشی پابەند دەبوون بە فەرمانەكانی وەك دینداری كردنێك، وای دەبینن لە عیبادەتە كە ئەگەر خومەینی قسەیەكی كرد ئەوا پابەند بین بە قسەكەی هەر بۆیە جەنگی بەعسییەكانیان كرد بۆ ماوەی هەشت ساڵ چونكە خومەینی ڕازی نەبوو ئاشتەوایی بكرێت، وە هیچ یەكێكیان پاشگەز نەدەبوونەوە، بەڵكو كاتێك بە هەر یەكێكیانی دەوت تۆ دەچیتە بەهەشت و ئەمەش كلیلەكەیە ئەویش باوەڕی بە خومەینی دەكرد لەمەدا ! .

كەوایە ئەو سەرۆكی دەوڵەتێك بوو و گوێی بۆ دەگیرا و گوێڕایەڵی دەكرا و سەرپێچی نەدەكرا لە هەر قسەیەك كە بیكردایە، مەگەر نەیدەتوانی پیاوێكی ئێرانی بنێرێت بۆ بەریتانیا بە چەكێكی بێدەنگ بۆ

ئەوەی ئەم سەلمانە بکوژێت! پاشان بابەتەکە کۆتایی پێدەهات، بۆچی جیهان دەوروژێنی و وریا دەکەیتەوە لە کوشتنی ئەم کەسە، وە ئەگەر لەوێ کەسێك شوێنەکەی نازانێت و یەکێکی تر شوێنەکەی دەزانێت هەواڵ بدات بەوەی دەتوانێت! یانی تۆ ناتوانیت؟! بۆیە ئەم فەتوایە لەسەر بنەمای خۆشەویستنی دین یان بەرگری کردن لە رسول الله (ﷺ)یان لە خێزانەکانی نەبوو.

دەگەڕێنەوە لای بابەتەکەمان، ئەم فەتوایە دەبەستینەوە بە ئازادی ڕادەربڕین، ئازادی ڕادەربڕین لە بەریتانیا دوای ئەوەی ئەم فەتوایە دەرچوو، ڕاستەوخۆ هەندێك ڕێکاریان گرتەبەر بۆ ئەوەی بیسەلمێنن ئەوان دیموکراسیخوازن و ئەوان پابەندن بە ئازادی ڕادەربڕین، جا پاسەوانی کردنی بەردەوامیان بۆ سەلمان ڕوشدی دەستەبەر کرد، لە ماڵەکەی پاسەوانی و کاتێك هاتووچۆ دەکات بە پاسەوانەوە، بۆچی؟ چونکە پیاوێکی هەڕەشە لێکراوە بەهۆی پەڕتوکێك کە نووسیویەتی لە وڵاتێکی دیموکراسی کە باوەڕی بە ئازادی ڕادەربڕین هەیە، کەوایە ئامانج لە فەتواکە دابینکردنی پارێزگاری بوو بۆ سەلمان ڕوشدی نەك کوشتنی، وە بەریتانیەکانیش ئەوەیان کرد کە خومەینی دەیەویست، چونکە ئەگەر بکوژرێت لەوانەیە شتێکی تری هەبێت و بتوانێت لە ئیسلام و موسڵمانان بدات، بۆیە مانەوەی باشترە لە کوشتنی، جا بەهۆی ئەم فەتوایە حکومەتی بەریتانی لەژێر حوکمی دیموکراسی و ئازادی ڕادەربڕین پارێزگاریان بۆ سەلمان ڕوشدی دابین کرد تا ئێستاش، وە هیچ کەسێکیش ناتوانێت شتێك بکات، بۆچی؟ دەڵێت چونکە وڵاتەکەمان وڵاتێکی دیموکراسییە، وە لە ئازادی دایە کە چیمان بوێت بیڵێین، ئەی خەڵکەکە! ئێوە قسە دەڵێن بە پێغەمبەری ئوممەتێك کە ژمارەیان ملیار و نیوێکە و کەچی دەڵێی ئازادی ڕادەربڕین! بەڵێ، ئەمە ئازادی ڕادەربڕینە، ئەمە جێبەجێکردنی کردارییە بۆ ئازادی ڕادەربڕین لە وڵاتانی ڕۆژئاوا.

نموونەیەکی تر: ڕۆژنامەنووسێکی بەریتانی وێنەیەکی کاریکاتێری لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) کێشا -دەستی ئیفلیج ببێت- بە هەمان شێوە موسڵمانان ڕازی نابن سوکایەتی بکرێت بە رسول الله (ﷺ)، بەڵام شێوازی وەڵامدانەوەکە خۆپیشاندان و ئیدانەکردن و نکوڵی کردن و هاوشێوەی ئەمانە، پاشان دوای ئەوە ناتوانیت هیچ شتێك بکەیت، لە ڕێگەی خۆپیشاندانەکان و لە ڕێگەی زانایانی کەناڵەکان داوایان کرد لە حکومەتی دانیمارکی -ڕۆژنامەنووسەکە لە دانیمارك بوو نەك لە بەریتانیا- داوایان لێکرد تەنها داوای لێبوردن بکات لە موسڵمانان چونکە سوکایەتی کردووە بە پێغەمبەرەکەیان، ڕازی نەبوو!، داوایان لە حکومەتی دانیمارکی کرد، ببورن خەڵکینە! هەموو وڵاتانی ئەوڕوپا کۆکن لەسەر ئەوەی ئێمە داوای لێبوردن ناکەین؛ لەبەرئەوەی ئێمە دەوڵەتێکی دیموکراسیین و داوای لێبوردن کردنیش زیان بە ئازادی ڕادەربڕین دەگەیەنێت لە لامان، ئەمە واتە ئێمە ناتوانین بڵێین دوای ئەمڕۆ، ئازادی ڕادەربڕینمان ناوێت ئەگەر داوای لێبوردن بکەین، مانای وایە هەر کەسێك بە قسەیەك سوکایەتی بە موسڵمانان بکات و ئەویش داوای لێبوردن بکات، وە قسە بە فڵان بوترێت ئەویش داوای لێبوردن بکات، دەڵێت ئێمە داوای لێبوردن ناکەین چونکە دەوڵەتەکەمان دەوڵەتێکی دیموکراسییە، وە لە نێو کۆڵەکەکانی دیموکراسییش ئەوەیە کە چیمان بوێت بیڵێین، تۆش توڕە دەبیت یان توڕە نابیت ئەوا شتەکە پەیوەندی بە

خۆتەوە هەیە و پەیوەندی بە منەوە نیە بەهیچ جۆرێك.
وە وەك زیادەڕۆییکردنێك لە چەسپاندنی ئازادی ڕادەربڕین و وەك بەرگرییێك لەو وێنەکێشە، سێزدە ڕۆژنامەی ئەوڕوپی دووبارە ئەم وێنانەیان بڵاوکردەوە بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە ئێمە دەوڵەتێکی دیموکراسیین و ئێمە کار دەکەین بە ئازادی ڕادەربڕین، جا خراپە و سوکایەتی بکات بە دینێك یان پێغەمبەرێك یان پەیامێك، ئەم بابەتە گرنگ نیە بەلایانەوە، ئەمەش نموونەیەك بوو بۆ ئازادی ڕادەربڕین لە لای ئەوان و هەر ئەمەشیان دەوێت بۆ ئێمە.
نموونەی سێیەم: ئەمریکیێك فیلمێکی بەرهەم هێنا ناسراوە بە فیلمە خراپ و سوکایەتیکەرەکە بەرامبەر پێغەمبەر (ﷺ)، لەو ماوەیەی سوکایەتیکردنەش هەروەك دەزانن جیهاد و جەنگ هەبوو، وە موسڵمانان هەستیان بەخۆیان دەکرد و دەیانەوێت سەربەرز و شکۆمەند بن، جا هەڵپەکردنەکە لە فیترەتەوە بوو، بە فیترەت موسڵمانان لە هەموو وڵاتانی موسڵمانان هەڵپەیان کرد و دەرچوون، جا باڵیۆزی ئەمریکایان کوشت لە لیبیا، و هێرشیان کردە سەر باڵیۆزخانە لە میصر، و هێرشیان کردە سەر باڵیۆزخانە لە فڵانە شوێن، فیترەت پاڵیدان کاتێك خەڵکانێك دەڵێن ئێمە دیموکراسیخوازین و ئازادی ڕادەربڕینمان بۆ هەیە و ئازادی ڕادەربڕین پاڵیدان بۆ ئەوەی سوکایەتی بە پێغەمبەرەکەمان بکەن! بۆیە کاردانەوەکە بەهۆی فیترەتەکەوە بوو بەم شێوەیە، ئەمەش لە ڕۆژی یەکەم و دووەم بوو، لە ڕۆژی سێیەم زانایانی کەناڵەکان لە شوێنکەوتووانی ئەفلاتون هاتنە نێو باسەکەوە، بانگخوازانی دیموکراسی کە باسی ئازادی ڕادەربڕین دەکەن -قەرزاوی و هاوشێوەکانی- دەستیان کرد بە نکوڵی کردن لەم کارانەی موسڵمانان، بەڵکو ناویان نا بە "دڕندەیی و دواکەوتوویی"، دروستەکە ئەوەیە وەڵامێکی شارستانی بدرێتەوە دەربچیت لە خۆپیشاندانەکان و داوای مافی خۆت بکەیت و ئیدانە بکەیت و وایان لێبکەیت داوای لێبوردنت لێبکەن، وە یوسف قەرزاوی وتی: "ئێمە ئێستا بۆ ماوەی ساڵێکە یاخود دوو ساڵە کار دەکەین لە بەرهەمهێنانی فیلمێك دەربارەی پێغەمبەر (ﷺ)" جا فیترەتی موسڵمانانیان گۆڕی و خەڵکیش هێور بوونەوە.
ئەگەر باوکان فیترەتی منداڵەکانیان دەگۆڕن ئەوا ئەوانەش فیترەتی موسڵمانان دەگۆڕن، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت (كُلُّ مَولُودٍ يُولَدُ عَلَى الفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ أَوْ يُمَجِّسَانِهِ) [١] منداڵ لەسەر فیترەت و پاکی لە دایك دەبێت بەڵام باوکەکەیە کە دەیگۆڕێت، موسڵمانان لەسەر ئەم فیترەتە دەرچوون، سوکایەتی کراوە بە رسول الله (ﷺ)بۆیە ئەوانیش ویستیان تۆڵە بسێننەوە، ئەوانەش [بەناو زاناکان] تەداخولیان کرد و فیترەتی موسڵمانانیان گۆڕی و وایان لێکردن دابنیشن و داوای مافی خۆیان بکەن لە ڕێگەی خۆپیشاندان و ئەم شتانە پاشان بابەتەکە پوکایەوە و کۆتایی پێهات، وەك زانراویشە پێغەمبەر (ﷺ)کاتێك کەسێك سوکایەتی بکردایە دەیفەرموو: کێ هەیە بۆ فڵانە کەس چونکە بەڕاستی ئازاری الله

(١) رواه الشيخان

و پێغەمبەرەکەی داوە، کێ هەیە بۆ کەعبی کوڕی ئەشڕەف؟ بەڕاستی ئازاری الله و پێغەمبەرەکەی داوە، کێ هەیە بۆ خالیدی کوڕی سوفیان؟ بەڕاستی ئازاری الله و پێغەمبەرەکەی داوە، ئەوانە بە گەنجانی ئوممەتیان نەوت کێ هەیە بۆ ئەمریکا بەڕاستی ئازاری الله و پێغەمبەرەکەی داوە، بەڵکو وتیان خۆپیشاندان بکەن و بە ڕێگەیەکی شارستانی دیموکراسی داوا لە حکومەت بکەن! ، ئەمە ئەو ملکەچیەیە کە دەیانەوێت موسڵمانان تیایدا بژیێن لە ڕێگەی دیموکراسی و ئازادی ڕادەربڕین، هەروەك چۆن ئازادی ڕادەربڕینیان بۆ هەیە تۆش بە هەمان شێوە دەربچۆ و بۆچوونەکەت بخەڕوو، ئەمە ڕایە و ئەووەش ڕایە کێشە نیە، بەڵام سوکایەتی کردن بە رسول الله (ﷺ) ئەویش کێشە نیە! .

کەوایە لێدان لە دین لێرەوە ڕاستەوخۆیە، بەڵام لێدان لە دین بەڕێگەیەکی ناڕاستەوخۆ -لە ڕێگەی ئازای ڕادەربڕین لە وڵاتانی دیموکراسی- قانون ڕێگەیان پێدەدات هەر حیزبێك دابنێن لەسەر هەر بیروباوەڕێك بێت، هەر بۆیەش دەبینی لە وڵاتەکەمان حیزبی شیوعی عێراقی هەیە کە جیاوازیان نیە لەگەڵ حیزبی ئیسلامی عێراقی، بە هەمان شێوە دەبینی لە پاڵ ئەوان حیزبی عەلمانی هەیە، وە حیزبی عەلمانی: وەرگێڕانی دەقی بۆ ئەم وشەیە بریتییە لە "نادینی" بەڵام ناتوانن بڵێن ئێمە حیزبانێکی نادینیین بۆیە ئەم زاراوەیە بۆ خۆیان بەکاردێنن و دەڵێن: عەلمانی، چونکە وشەی عەلمانی هەر چۆنێك بێت قبوڵ دەکرێت بەڵام "نادینی" قبوڵ ناکرێت بە هەر بارێك لە بارەکان، بۆیە پێناسەی عەلمانیەت لە فەرهەنگی "ئۆکسفۆرد" بەم شێوەیە پێناسەیان کردووە دەڵێت: "چەمکێکە وا دەبینێت کە ئەخڵاق و فێرکردن لەسەر بناغەیەکی نادینی دادەمەزرێن" ئەوانەی دەیانەوێت کەسانێك بهێننە کایەوە هیچ پەیوەندیێکیان نەبێت بە دین ئەوانەش پێیان دەوترێت "عەلمانییەکان"، جا هەڵنەخەڵەتێین بە وشەی عەلمانی و وا گومان ببەین ئەوان خاوەنی زانست و شتی لەم جۆرەن، نەخێر، ئەوانە نادینییان دەوێت، وە ئێستا ئەو حیزبانەی هەن و بە فەزڵی دیموکراسی و بانگخوازانی و ئازادی ڕادەربڕین ئێستا بوونیان هەیە، وە خاوەنی هەموو هۆکارەکانی ڕاگەیاندنن جا بیستراو بێت یان خوێنراو یان بینراو، هەموو ئەو دەزگایانە دەستەبەر کراوە بۆ بانگەوازکردن بۆ شیوعیەت و بۆ بانگەوازکردن بۆ عەلمانیەت، وە هیچ کەسێکیش ناتوانێت دژی بوەستێتەوە؛ چونکە دەوڵەت دەوڵەتێکی دیموکراسییە و لە کۆڵەکەکانی دیموکراسییش ئازادی ڕادەربڕینە، ئەمەش بواری یەکەم بوو لە بوارەکانی ئازادی ڕادەربڕین.

بواری دووەم "تێکدانی ئەخڵاقە" نایانەوێت شتێك بمێنێت بەناوی ئەخڵاق؛ چونکە پێشتر باسم کرد کە جوولەکە لە پیلانەکانیان ئەوەیە دەستبگرن بەسەر جیهان، بەڵام ئەو کۆسپانەی لەبەردەمیانە: دین و ئەخڵاقە، دینیش بەم شێوەیە [واتە هەوڵدەدەن بۆ نەهێشتنی] لە ڕێگەی ئازادی ڕادەربڕین، وە بە هەمان شێوە ئەخڵاقیش تێکدەدەن لە ڕێگەی ئازادی ڕادەربڕین، وە پاکی و بێگەردی بۆ الله عز وجل لەوەی بهێڵێت وا بکەن، بەڵام ئەوان هەوڵدەدەن، جا بەڕاستی توانیان وا لە وڵاتانی ئەوڕوپا بکەن وازبێنن لەو شتەی ناوی ئەخڵاقە، ئەوان خەڵکانێکن وەك ئاژەڵ، یەکێك لەوانەی سەردانی ئەو وڵاتانەی کردووە -ڕاستەوخۆ گوێم لێی بووە- وتویەتی: والله لە هیچ شتێك جیاوازیان نیە لەگەڵ ئاژەڵان، خواردن و

خواردنەوە و بابەتەکانی جنس -پەنا بە الله- وە سەرچاوەی ئەم خراپەیەش لێدوانێکی "جولدا مائیر"ــە کە سەرۆك وەزیران بوو لە ماوەیەکدا [سەرۆك وەزیرانی جوولەکە] دەڵێت: "دەمانەوێت نەوەیەك پەروەردە بکەین شەرم نەکات لە ئامێری وەچە خستنەوەی"، بەڵام بەدڵنیاییەوە جوولەکە نا بەڵکو گەلانی تر ئەوانەی پێیان دەڵێن "جویم" جا "جویم" بریتییە لە غەیری جوولەکە، دەمانەوێت لەوانە کەسانێك پەروەردە بکەین شەرم نەکەن لە ئامێری وەچە خستنەوەیان ئەمەش نایەتە دی تەنها لە ڕێگەی دیموکراسی و لە ڕێگەی ئازادی ڕادەربڕین نەبێت، جا لە ڕێگەی ئازادی ڕادەربڕین گۆڤارە ئیباحیەکان هەیە کە ئافرەت لەگەڵ پیاو پیشان دەدەن بە هەموو جەستەیانەوە، وە کەناڵە ئاسمانیە تایبەتییەکان هەیە لەم بوارە، وە ڕۆژنامە هەیە و ڕاگەیاندن هەیە، وە شوێنەواری ئازادی ڕادەربڕین لە بانگەوازکردن بۆ شکاندنی ئەخلاق و بڵاوکردنەوەی فاحیشە دەرنەکەوتووە تەنها لە لاپەڕەی کۆتایی نەبێت لە وڵاتانی موسڵمانان، وە دەشێت دوای ئەمە لەناو ڕۆژنامەکە هەبێت بەڵام لاپەڕەی کۆتایی ئەوا تایبەتە بەم باسە، بەڵام ئەگەر بتوانن بەردەوام بن لە بڵاوکردنەوەی دیموکراسی و ئازادی ڕادەربڕین ئەوا هەمان ئەو شتانە بڵاو دەکەنەوە کە بڵاویان کردەوە لە وڵاتانی ڕۆژئاوا بەجۆرێك کارەکە گەیاندوونی بەوەی بگۆڕێن بۆ ئاژەڵ پەرژین بێت لە ڕووتان.

پیاوێك ماوەیەك لە ئەڵمانیا بوو بۆی گێڕامەوە وتی: ئەڵمانیا دەوڵەتێکە هەمیشە هەور داپۆشیوە، بە دەگمەن خۆر دەردەکەوێت، بەڵام کاتێك خۆر دەردەکەوێت پیاو و ئافرەت بە خێرایی دەچن بۆ باخچە گشتییەکان، وە پاڵ دەدەنەوە لە دیار تیشکی خۆر لەسەر ئەو شێوەیەی الله عز وجل دروستی کردوون، دەیوت سەیر ئەوەیە کەسیش گرنگیان پێنادات،ئەم ئافرەتە ڕووتە پاڵیداوەتەوە و ڕۆژنامە دەخوێنێتەوە و خەڵکیش تێدەپەڕن کەس ئاوڕی لێناداتەوە!، چۆن گەیشتنە ئەم ڕادەیە؟ لە ڕێگەی ئازادی ڕادەربڕین و لە ڕێگەی ئەوەی شتێك نیە بەناوی "ڕەگەز"، چونکە تێربوونە لەم کارە.

ئازادی ڕادەربڕین لە ڕێگەی شکاندن و تێکدانی ئەخلاق بەم هۆکارانە بەرەو زیناکردنی بردن لەگەڵ مەحرەمەکان، وە زینای مەحرەمەکان هەروەك دەزانن -پەنا بە الله- ئەوەیە کە پیاو جووت ببێت لەگەڵ دایکی یان خوشکی یان کچی، ئەمەش ئێستا بەربڵاوە لە ئەوروپا و لە ئەمریکا بەتایبەت، بۆش -ڕاستەوخۆ لە خۆیەوە گوێم لێنەبوو بەڵام گوێم لە قسەکەی بوو- لە چوارچێوەی ئامانجەکانی کاتێك ویستی بێتە عێراق وتی: "واتان لێدەکەین ئەمە بکەن"؛ چونکە ئەمریکییەکان بەمە دەزانن جا وتی: "واتان لێدەکەین ئەمە بکەن"، چۆن؟ بەدڵنیاییەوە سەربازی ئەمریکی نایەت بوەستێت لەسەر سەری موسڵمانێك و ناچاری بکات لەسەر ئەنجامدانی ئەم کارە، بەڵکو لە ڕێگەی ئازادی ڕادەربڕین، لە ڕێگەی شکاندنی ئەخلاق، لە ڕێگەی کەناڵەکان وا لە خەڵك دەکەن ئەم کارە بکەن، چۆن؟ بەوەی پیاو لەگەڵ دایکی دانیشتووە و سەیری ئەم دیمەنانە دەکەن، بەدڵنیاییەوە شەیتان دەیانوروژێنێت بۆ ئەو فریودەرانەی وای لێدەکات زینا لەگەڵ دایکی بکات، کە هەر ئەمەیە ڕوودەدات لە وڵاتەکانیان، وە هەر ئەمەیە کە ڕوویدەدا ئەگەر الله عز وجل کەسانێکی بێدار نەکردایەتەوە بەرپەرچیان بدەنەوە و دوچاری

دۆڕان و شكستیان بكەن.
كەوابوو ئەمە ئازادی ڕادەربڕینە لە وڵاتانی دیموكراسی، وە ئەمەیە بۆ ئێمەیان دەوێت لە ڕێگەی دیموكراسی و لە ڕێگەی كۆڵەكەكانی دیموكراسی، بەوەی كەسانێك لەنێومان دەربچن و قسە بكەن لەسەر ئیسلام و هیچ كەسێكیش نەبێت لێپرسینەوەیان لەگەڵ بكات، كەسانێك لەنێومان دەربچن بانگەشە بكەن بۆ عەلمانیەت و بۆ شیوعیەت و هیچ كەسێكیش نەبێت دژیان بوەستێتەوە، بۆچی؟ چونكە دیموكراسی ئەگەر ڕێڕەوی خۆی گرت ئیتر هیچ كەسێك ناتوانێت دژی ئەوانە بوەستێتەوە، هەروەك چۆن كەس ناتوانێت نكوڵی بكات و دژی بوەستێتەوە لە ئەمریكا و لە بەریتانیا و لە وڵاتانی تریش، ئەمە ئەو دیموكراسییەیە بۆ ئێمەیان دەوێت.
لەبارەی ئازادی ڕادەربڕینەوە، وتەی كەسێكم بەرچاو كەوت پێی دەوترێت "ڕابەری گشتی"ـی ئیخوانی میصر، ڕاستەكەی ئەوەیە پێی بوترێت "گومڕاكەری گشتی"، "عمر التلمساني" سەرنج بدە چی دەڵێت دەربارەی ئازادی ڕادەربڕین، ئەم قسەیەی كردووە لە دیدارێكی گۆڤاری "المجتمع" لەگەڵ ئەو لە بەرواری ٢٧-٥-١٩٨٦ ، دەڵێت: "ئێمە پشتگیری هەموو حیزبەكان دەكەین لە هەڵوێستێكی ڕێزگرتنی ئازاد بۆ بۆچوونی كەسانی تر" هەموو حیزبەكان، هەروەك ئاشكرایە ئەوان پشتگیری ئازادی ڕادەربڕین دەكەن، ئێمەش بە هەمان شێوە پشتگیریان دەكەین، واتە پشتگیری شیوعی دەكات، پشتگیری قیبتی دەكات، پشتگیری فڵان دەكات، كێشە نیە هەموومان یەكسانین لە بابەتی ڕادەربڕین، "ئێمە پشتگیری هەموو حیزبەكان دەكەین لە هەڵوێستێكی ڕێزگرتنی ئازاد بۆ بۆچوونی كەسانی تر، وە ئەگەر من سور بم -سەرنج بدە شیكردنەوەكەی- وە ئەگەر من سور بم لەسەر ئەوەی خەڵك بۆچوونەكەم وەربگرن، جا بۆچی ئەوە قەدەغە بكەم لە خەڵكی كە بۆ خۆم ڕێی پێدەدەم" ئەی كابرا تۆ بەناوی ئیسلام قسە دەكەی، ئەوانیش قسە دەكەن كە قیبتی و شیوعی و عەلمانیین، سەرنج بدە دوای ئەمە دەڵێت -وەك ئەوەی ڕەخنە بگرێت لەو كەسەی ڕەخنەی لێدەگرێت- : "وە ئایا لە ئازادی دایە كە من لەمپەر بخەمە نێوان خەڵك و دەربڕینی بۆچوونەكانیان دوای ئەوەی دادوەرترینی دادوەرەكان ئەم مافەی پێداون لە ڕوونی و ئاشكراییێكدا كە گومانی تیادا نیە **(فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ)** " ئەمە سەرێكە لە ئیخوان، جا ئازادی ڕادەربڕین و دیموكراسی قبوڵكراوە لای ئەوانە، وە ئێستا ئەوانەش كە پێیان دەڵێن مورجیئەی سەردەم چوونەتە پاڵ كاروانەكە، وە ئەوانە تەنها لە ڕووی پێناساندنەوە پێیان دەڵێین مورجیئە، ئەگینا ئەوانە كەڕامییەن، جەهمیەن، ناویان بنێ بەوەی حەز دەكەی، بەڵام زاراوەی مورجیئەیان بۆ بەكارهێنراوە، جا لە حیزبی نور -بە نموونە- چوونە پاڵ كاروانەكە جا ئێستا لەگەڵ سیسی ـین، لە خەلیج چوونە پەرلەمانی كوەیتی، وە لە قەتەر و ئیتر بەم شێوە دەیانبینی، كەوابوو ئەوانە هەموویان دیموكراسییان دەوێت و ئازادی ڕادەربڕینیان دەوێت.
ئایا دەزانی ئیبلیس بە چی هەڵیخەڵەتاندوون؟ بەوەی ئەو خەڵكە گۆڕەپانەكە لە وڵاتانی دیموكراسی بە بازاڕێك دادەنێن بۆ پیشاندانی كەلوپەكان، دەڵێت: هەموویان كەلوپەل و كاڵاكانی خۆیان پیشان دەدەن

بەبێ کێشە، شیوعی پیشانی دەدات، عەلمانی پیشانی دەدات، نەتەوەپەرست پیشانی دەدات، ئێمەش کەلوپەلەکانمان پیشان دەدەین، بەو هیوایەی کەلوپەلەکانیان باشترین کەلوپەل بێت و خواستی لەسەر بێت زیاتر لەوانی تر، بەڵام بەردەوام خۆیان فریو دەدەن بەم کارە و موسڵمانانیش فریو دەدەن، چ کەلوپەلێکە کە تۆ پیشانی دەدەیت ئەی کابرا! ئیسلامێك لەژێر ناوی دیموکراسی! ئیسلامێك لەژێر ناوی ئازادی بیروباوەڕ! ئیسلامێك لەژێر ناوی ئازادی ڕادەربڕین! چ ئیسلامێکە ئەوەی تۆ دەیخەیتە ڕوو؟ ئەو ئیسلامەی پێت وایە جیهادەکەی خراپە و توندوتیژییە! ئەو ئیسلامەی دادەبەزیتە سەر موجاهیدان ئەگەر کەسێکیان کوشت لە سەرتاسەری زەوی! جا ئەمەیە دیموکراسی لە ئازادی ڕادەربڕین.

ئەم بابەتە بخە بەردەم شەرعی پاك و پیرۆزمان، ئازادییمان هەیە -ولله الفضل والمنة- بەڵام ئازادییەکەمان ڕێکخراوە بە ڕێکخەرەکانی شەرع، چونکە باوەڕمان بە الله و باوەڕمان بە ڕۆژی دواییە، وە دەزانین کە الله عز وجل هەندێك فەڕز و دانراوی بۆ داناوین، وە بەهۆی ئەم فەڕزانەوە دەزانین ڕۆژی قیامەت لێپرسینەوەمان لەگەڵ دەکرێت، بۆیە سورم لەسەر ئەوەی سەرپێچی شەرع نەکەم بۆ ئەوەی لێپرسینەوەم لەگەڵ نەکرێت لە ڕۆژی قیامەت.

بەڵگەکان لەسەر ئەمە لە بابەتی: ئایا بۆم هەیە هەموو قسەیەك دەربڕم، یان هەموو قسەیەك بڵاوبکەمەوە، یان هەموو قسەیەك بڵێم، یان هەموو قسەیەك بنوسم؟ نەخێر، ڕێکدەخرێت بە ڕێکخەرەکانی شەرع، وە بەڵگەی ئەمەش لە پەڕتوکی الله عز وجل وجل﴿...عَنِ ٱلۡيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٞ ١٧ مَّا يَلۡفِظُ مِن قَوۡلٍ إِلَّا لَدَيۡهِ رَقِيبٌ عَتِيدٞ ١٨﴾[1] ، واتە: لە لای ڕاست و چەپیەوە چاودێرن و دانیشتوون * هەر قسەیەکی لەدەم دەردەچێت خێرا چاودێرێکی ئامادە تۆماری دەکات. دوو فریشە کە الله عز وجل پێی سپاردوون هەموو ئەوەی دەردەچێت لە هەر تاکێکمان بینوسنەوە، وە الله عز وجل وەسفی کردوون بە (رَقِيبٌ عَتِيدٞ) هەروەك دەزانن شێوازی موبالەغەیە بەڵگەیە لەسەر توندی چاودێرییەکە و لەسەر توندی خۆئامادەکردنەکە؛ چونکە (عَتِيدٞ) بە مانای ئامادەبوو دێت، لەگەڵ دەرچوونی هەر وشەیەك لە زارتەوە ڕاستەوخۆ دەنوسرێت لە تۆمارەکە، هەر بۆیە کاتێك ئیمامی أحمد -رحمه الله- لە نەخۆشی مردنەکەی نوزە وناڵەی دەکرد، جا یەکێك لە نزیکەکانی، پێم وابێت یەحیای کوڕی معین بوو -ڕەحمەتی الله تعالی لە هەموویان بێت- وتی: نوزە و ناڵە دەنوسرێت لە تۆمارەکە (مَّا يَلۡفِظُ مِن قَوۡلٍ إِلَّا لَدَيۡهِ رَقِيبٌ عَتِيدٞ) ئینجا ئیمامی أحمد ناڵەکردنەکەی وازلێهێنا، چونکە نوزە و ناڵەکردن دەنگێکە گوزارشت دەکات لە سکاڵاکردن و لە ئازار، هەروەك چۆن کاتێك تووشی ئازار ببم بڵێم "ئاە" جا ئەمە دەربڕینێکە بۆ ئەم وشەیە، جا یەحیای کوڕی معین وای دەبینی تەنانەت ئەم نوزە و ناڵەیەش تۆمار دەکرێت لە تۆماری لێپرسینەوە.

(١) ق: ١٧-١٨.

ئەمە لە دونیا، شوێنەوارەکەی کەی دەردەکەوێت؟ لە فەرموودەی الله تعالى ﴿ وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ فَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَٰوَيْلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلْكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحْصَىٰهَا ۚ وَوَجَدُوا۟ مَا عَمِلُوا۟ حَاضِرًا ۗ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ﴿٤٩﴾ ﴾[١] ، واتە: نامەی کردەوەی هەر کەس دادەنرێت، (ئیماندااران دڵخۆشن) بەڵام تاوانباران دەبینیت دڵە لەرزێ و دڵە ڕاوکێیانە لە کار وکردەوەی ناپەسەندی تۆمار کراویان، بۆیە دەڵێن: هاوار لە ئێمە و ئەم نامە و دۆسیەیە چیە؟! هیچ گوناهێکی ورد و درشت بەجێ ناهێڵێت بەڵکو هەمووی تۆمار کردووە، ئەو خەڵکە هەرچیان کردووە (بە دەنگ و ڕەنگەوە) ئامادەیە، بێگومان پەروەردگاری تۆ ستەم لە هیچ کەس ناکات.

کەوایە ئەو ئازادییە لە کوێیە کە دەیانەوێت بیهێننە وڵاتانی موسڵمانان؟ مەگەر ئەم ئایەتانە ڕێکم ناخات؟ نابێت قسەیەك بکەم کە دەزانم لێپرسینەوەم لەگەڵ دەکرێت لەسەری لە ڕۆژی قیامەت.

سەبارەت بەوەی هاتووە لە فەرموودەکانی رسول الله (ﷺ)، فەرموودەیەکی (معاذ (رضي الله عنه)) کە ئیمامی (الترمذی) گێڕاویەتیەوە و بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: رسول الله (ﷺ)فەرمووی کاتێك معاذ پرسیاری لێکرد: ئەی پێغەمبەری الله ئێمە لێمان دەگیرێت بەهۆی ئەوەی دەیڵێین؟ فەرمووی: "دایکت جەرگی نەسوتێت ئەی معاذ، مەگەر خەڵکی کە دەمەوڕوو دەخرێنە ئاگرەوە هەر بەهۆی قسە و وتە خراپەکانیان نیە" کەوایە هۆکاری چوونە ئاگر جاری وایە بەهۆی قسەکردنمانەوەیە، ئینسان قسە دەکات ئینجا لێپرسینەوەی لەسەر دەکرێت و بەهۆیەوەش لەوانەیە بچێتە نێو ئاگر، کەوابوو کوا ئازادی ڕادەربڕین و ئازادی قسەکردن و ئەم شتانە؟

فەرموودەیەکی تر کە ئیبن ماجە لە ئەبی هورەیرە وە (رضي الله عنه)گێڕاویەتیەوە، رسول الله (ﷺ)دەفەرموێت: "الرجل يتكلم بالكلمة من سخط الله لا يرى بها بأسا، فيهوي بها في نار جهنم سبعين خريفاً" واتە: پیاو هەیە قسەیەك دەکات کە الله تعالى تورە دەکات هاوکات بەلایەوە ئاساییە، بەهۆیەوە حەفتا ساڵ دەخرێتە نێو ئاگری دۆزەخەوە. چۆن ئازادی ڕادەربڕین دەگونجێنی لەگەڵ ئەم بەڵگانە و ئەم فەرموودانە؟! بەڵکو هەندێك قسە هەیە خاوەنەکەی دەباتە دەرەوە لە دین، الله تعالى دەفەرموێت ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا۟ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ ۚ إِن نَّعْفُ عَن طَآئِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَآئِفَةًۢ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ مُجْرِمِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾[٢] ، واتە: کاتێك لێیان دەپرسیت (ئەوە خەریکی چین؟!) ئەوە بێگومان دەڵێن: بەڕاستی ئێمە تەنها دەمەتەقێ و گەمە و گاڵتەمان دەکرد، پێیان بڵێ: ئایا ئێوە بە الله و ئایەت و فەرمانەکانی و پێغەمبەرەکەی گاڵتەتان دەکرد ؟! * پاکانە مەکەن، چونکە بەڕاستی ئێوە بێباوەڕ بوون دوای ئەوەی لە ڕواڵەتدا باوەڕتان هێنابوو ئەگەر لە دەستەیەکتان خۆش بین (دوای تەوبەی ڕاستەقینە) دەستەیەکتان هەر ئازار دەدەین بەهۆی ئەوەی

(١) الكهف:٤٩.

(٢) التوبة: ٦٥-٦٦.

تاوانبار و تاوانكار بوون. هۆكاری دابەزینی ئەم ئایەتە لە جەنگی تەبوك ئەوە بوو، كەسانێك لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ)دەرچوون بۆ جیهاد جا هەندێك قسەیان دەربڕی وتیان: "هاوشێوەی ئەم هاوەڵانەمان نەبینیوە (مەبەستیان هاوەڵانی رسول الله بوو (ﷺ)) ورگ زل و درۆزن و ترسنۆك لە كاتی ڕووبەڕووبوونەوە" ئینجا الله عز وجل ئەم ئایەتەی دابەزاند، ئەوانیش دەهاتن بیانویان دەهێنایەوە و پێغەمبەریش (ﷺ)دەیفەرموو (أَبِٱللَّهِ وَءَايَـٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ * لَا تَعْتَذِرُوا۟ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَـٰنِكُمْ ۚ إِن نَّعْفُ عَن طَآئِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَآئِفَةًۢ) پیاوێكیان لەگەڵ بوو ناوی "مُخشن بن حُميّر"، ئەم پیاوە تەنها پێكەنی، بەشداری نەكرد لە قسەكردنەكە، تەنها پێكەنی بە قسەكانیان، جا كاتێك بیانوی دەهێنایەوە بۆ رسول الله (ﷺ)، وتی: ئەی رسول الله ناوی خۆم و ناوی باوكم منی دانیشتاند، واتە ئەم بەڵایە تووشم بوو وەك دەزانی ناوم چیە: حُميّر -بچووكراوەی حمار [گوێدرێژ]- ، وە ئەم صەحابەیە دەیوت: خوایە من دەزانم ئایەتێك هەیە من دەگرێتەوە، خوایە مردنەكەم بكە بە كوژرانێك لە پێناو خۆت بەجۆرێك هیچ كەسێك نەڵێت شۆردرا،وە هیچ كەسێك نەڵێت كفن كرا،وە هیچ كەسێك نەڵێت نێژرا،جا كوژرا لە جەنگەكانی ڕیدە و هیچ كەسێك شوێنەوارێكی نەدۆزیەوە. ئەمە ئازادی ڕادەربڕینە!ئەمە دیموكراسییە!.

ئایەتێكی تر، جاری وایە قسە و وشە خاوەنەكەی دەباتە دەر لە دین ﴿يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُوا۟ وَلَقَدْ قَالُوا۟ كَلِمَةَ ٱلْكُفْرِ وَكَفَرُوا۟ بَعْدَ إِسْلَـٰمِهِمْ﴾[1] ، واتە: (دووڕووەكان) سوێند بە الله دەخۆن كە قسەیەكی نابەجێیان نەكردووە، كەچی سوێند بە خوا ئەوانە درۆ دەكەن، بەڵكو گوفتاری كوفر و بێباوەڕی هات بەدەمیاندا، ئەوانە دوای موسڵمانبوونیان بێباوەڕ بوونەوە. قسەیەك دەریكردن لە دین، هۆكاری دابەزینی ئەم ئایەتە: پیاوێك بەناوی "جلّاس" هاوسەرگیری كرد لەگەڵ ئافرەتێك كە منداڵێكی هەبوو لە پیاوێكی تر، وە پەیوەندی بەهێز هەبوو لە نێوان "جلّاس" و ئەم كوڕە، جارێكیان وتی: "ئەگەر ئەوەی محمد هێناویەتی حەق و ڕاست بێت، ئەوا ئێمە خراپترین لە گوێدرێژ" ئینجا ئەم كوڕە بە "جلّاس"ـی وت: والله تۆ خۆشەویستترین كەسی لە لام، وە حەز دەكەم تووشی هیچ ناخۆشیەك نەبیت، بەڵام قسەیەكت كرد ئەگەر لێی بێدەنگ ببم ئەوا لە شتێكی گەورە بێدەنگ بوومە، وە ئەگەر بیڵێم ئەوا شتێكی گەورەم وتوە و دینەكەشم خۆشەویستترە لە لام لە تۆ، وە ئەمەی گەیاندە پێغەمبەر (ﷺ)و "جلّاس" دەستی كرد بە سوێند خواردن كە من ئەم قسەیەم نەكردووە، جا الله تعالى ئەمەی دابەزاند (يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُوا۟ وَلَقَدْ قَالُوا۟ كَلِمَةَ ٱلْكُفْرِ وَكَفَرُوا۟ بَعْدَ إِسْلَـٰمِهِمْ )، ابن كثير -رحمه الله- لە تەفسیرەكەی لەوەی لەبیرم بێت دەڵێت: ئەو پیاوە دوای ئەمە تەوبەی كرد و بوو بە موسڵمانێكی چاك، ئەمە دینمانە ئەی برایان، كوا دیموكراسی، كوا ئازادی ڕادەربڕین؟! .

شتێكی تر: ئازادی ڕادەربڕین دەخەینە ڕوو لە بەرامبەر بابەتێكی تر لە دینی ئێمەدا، الله تعالى

(١) التوبة: ٧٤.

دەفەرموێت ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ﴾[1] ، واتە: بەڕاستی ئەوانەی حەز دەکەن زینا و تاوان لە ناو ئەوانەدا باوەڕیان هێناوە بڵاوببێتەوە، سزای پڕ ئێش و ئازار بۆیان ئامادە کراوە لە دونیا و ئاخیرەتدا. فاحیشە لە پەرتوکی الله تعالى بە مانای زینا هاتووە﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً ﴾[2] ، وە بە مانای کاری گەلی لوط هاتووە﴿أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾[3] ، وە بە مانای سەرپێچی و گوناە هاتووە﴿مَن يَأْتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ يُضَٰعَفْ لَهَا ٱلْعَذَابُ ضِعْفَيْنِ ﴾[4] لەبارەی دایکانمان خێزانەکانی رسول الله (ﷺ)، وە بە مانای ڕەزیلی هاتووە ﴿ ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ﴾[5] ئەمە لەوەی بیرم بێت لە بواری ڕەزیلی، وە لە بواری شیرکیش دێت پەنا بە الله.

کەوایە ئەمە فاحیشەیە، ئازادی ڕادەربڕین و دیموکراسی بانگەشە دەکەن بۆ هەموو ئەو فاحیشانە، بەوەی زینا هیچ کەسێك لێپرسینەوەی لەگەڵ ناکرێت لەسەری، بەڵکو لە ئازادی تاکەکەسییە، جا فاحیشە -بەم مانایانەوە- هەر کەسێك حەز بکات فاحیشە بڵاوببێتەوە لەناو ئیمانداران ئەوا سزا بەڵێن پێدراوەکەی لە لایەن الله ـەوە -عز وجل- دووانەیە: سزای دونیایی و سزای ڕۆژی دوایی؛ چونکە هەندێك سەرپێچی هەیە سزاکەی دونیاییە﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓا۟ أَيْدِيَهُمَا﴾[6]، ئەمەیان دونیاییە، ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ﴾[7] ئەمەیان لە ڕۆژی دواییە،بەڵام هی ئەوانە دووانەیە: دونیایی و ڕۆژی دوایی، بەڵام بۆ کێ؟ ئەوەی حەز دەکات، هەروەك دەزانن خۆشویستن و حەزکردن لە کارەکانی دڵە، جا ئەوەی لە دڵیەوە حەز بکات فاحیشە بڵاوبێتەوە لەناو ئەوانەی باوەڕیان هێناوە ئەوا سزای بە ئێش و ئازاریان بۆ هەیە لە دونیا و ڕۆژی دواییدا، هەر بۆیە ئیبن قەییم لە تەفسیرەکەی دەڵێت: "ئەمە دەربارەی ئەو کەسەی حەز بکات فاحیشە بڵاوبێتەوە، جا دەبێ چۆن بێت ئەوەی یارمەتی بڵاوبوونەوەی دەدات" ئازادی ڕادەربڕین! دیموکراسی! .

ئیبن تەیمیە -رحمە الله- دەڵێت: "ئەم حەزکردنە هیچ وتەیەك و کردارێکی لەگەڵدا نیە، ئەی چی بگات بەوەی وتەیەك یان کردارێکی لەگەڵ بێت" واتە حەز دەکات بە بڵاوبوونەوەی فاحیشە بەڵام قسەیەکی نەکردووە کە بەهۆیەوە فاحیشە بڵاوببێتەوە، یان کارێك بکات بەهۆیەوە فاحیشە بڵاوببێتەوە، ئەمە

---

(١) النور: ١٩.
(٢) الإسراء: ٣٢.
(٣) الأعراف: ٨٠.
(٤) الأحزاب: ٣٠.
(٥) البقرة: ٢٦٨.
(٦) المائدة: ٣٨.
(٧) النساء: ١٤٥.

هەڕەشەی لێكراوە لە لایەن الله عز وجل، ئەی دەبێ چۆن بێت ئەگەر هۆكاری ڕاگەیاندنی بۆ فەراهەم بهێنرێت بۆ بڵاوكردنەوەی فاحیشە لەژێر ناونیشانی: ئازادی ڕادەربڕین و دیموكراسی، كەوابوو كوانێ دیموكراسی و كوانێ ئازادی ڕادەربڕین لە دینی ئێمە.

شتێكی تر، ئێمەی موسڵمانان شتێكمان هەیە ناوی شەرمە، فەرموودەی (عبد الله بن عمر (رضي الله عنهما)) كە بوخاری -رحمه الله- گێڕاویەتیەوە دەڵێت: رسول الله (ﷺ)فەرمووی: "الإيمان بضع وستون شعبة، والحياء من الإيمان" واتە: ئیمان شەست[1] و هەندێك بەشە، وە شەرمیش لە ئیمانە. وە بە هەمان شێوە لە لای بوخاری هاتووە لە (ابن عمر) ـەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) بە لای پیاوێك لە ئەنصار تێپەڕی كە ئامۆژگاری براكەی دەكرد لەبارەی شەرمەوە، لە ڕیوایەتێكی تر هاتووە پێی دەوت: ئەو شەرمەی لە تۆ دایە زیانت پێدەگەیەنێت، جا پێغەمبەریش (ﷺ)فەرمووی: "وازی لێبێنە، چونكە بەڕاستی شەرم كردن لە ئیمانە"، كەوایە ئایا دەكرێت ڕازی ببین بەوەی كەسانێك یەكێك لەم فاحیشانە ئەنجام بدەن لە كاتێكدا لە دینەكەمان شتێك هەیە بەناوی شەرم! سەرنج بدە لەو بابەتانەی شەرم دەڕووشێنێت، چۆن پەروەردگارمان فێرمان دەكات لە پەڕتوكەكەی، ئێمە وتمان ڕۆژنامە و گۆڤار و كەناڵەكان هەموویان باسی پەیوەندی نێوان پیاو و ئافرەت دەكەن، لە كاتێكدا لە پەڕتوكی پەروەردگارمان كاتێك قسەمان بۆ دەكات دەربارەی پەیوەندی نێوان پیاو و ئافرەت بەم شێوەیە دەفەرموێت﴿ **أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ** ﴾[2]من تێدەگەم مەبەست چییە لە (**لَٰمَسْتُمُ**)، بەڵام شەرم ناڕووشێنێت، ئەدەبە، الله عز وجل پەروەردەمان دەكات چۆن قسە بكەین،لەبارەی مەریەم﴿ **قَالَتْ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِى بَشَرٌ** ﴾[3] من تێدەگەم مانای (**يَمْسَسْنِى**) چییە، بەڵام شەرم ناڕووشێنێت،﴿ **عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ ۖ فَٱلْـَٰٔنَ بَٰشِرُوهُنَّ** ﴾ [4] من دەزانم مانای (**بَٰشِرُوهُنَّ**) چییە،﴿ **نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ۖ** ﴾[5] تێدەگەم، بەڵام دەبینی ئەم وشانە دەردەبڕین؛ چونكە شەرم شەرم ناڕووشێنێت لە بابەتی پەیوەست بە نێوان پیاو و ئافرەت، ئایا ئەمانە پێیان دەوترێت ئازادی ڕادەربڕین؟!.

كەوایە چۆن ئەو شەرمەی كە لە ئیمان دایە، لەگەڵ ئازادی ڕادەربڕین و بڵاوكردنەوەی فاحیشە لەناو ئیمانداران دەگونجێنی؟

وە شتێكی تریش، من دەزانم كە هەموو قسەیەك دەریببڕم ئەوا الله عز وجل گوێی لێیە، هەموو وشەیەك

---

(١) لە لای مسلم بە (حەفتا و شەست)هاتووە ، مسلم برقم (٣٥).

(٢) النساء: ٤٣.

(٣) آل عمران: ٤٧.

(٤) البقرة: ١٨٧.

(٥) البقرة: ٢٢٣.

كە دەریببڕم و هەموو كارێك كە بیكەم، دەزانم بەدڵنیاییەوە الله عز وجل گوێی لەم قسەیەم دەبێت، كەوایە لێرەوە ئاگام لەو قسانە دەبێت كە دەیكەم لە ترسی ئەوەی قسانێك بكەم الله عز وجل گوێی لێبێت و پێی ڕازی نەبێت و لێم قبوڵ نەكات و لەوانەشە سزام بدات لەسەری، بەڵگەی ئەمەش فەرموودەی الله تعالى ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ﴾[1] واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ بێگومان الله وتووێژی ئەو ئافرەتەی بیست كە گفتوگۆت لەگەڵدا دەكات دەربارەی هاوسەرەكەی، سكاڵای خۆیشی بۆ لای الله دەبات، وە الله گوێی لە گفتوگۆكەتان بوو. دایكمان عائیشە -رضي الله عنها- دەڵێت [فەرموودەكە بوخاری ڕیوایەتی كردووە، وە شێخ بە مانا باسی دەكات] : "پاكی و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی بیستنی هەموو شتێكی گرتۆتەوە، من گوێم لە زۆرێكی ئەو قسانە نەبوو كە ئەم ئافرەتە دەیوت" چۆن؟ وەك دەزانن ژووری دایكمان عائیشە بچووك بوو، وە لەناو ئەم ژوورە پێغەمبەر ﷺ و ئافرەتەكە و دایكمان عائیشەی لێبوو، بەڵگە لەسەر بچووكی ئەم ژوورە ئەوەیە كاتێك پێغەمبەر ﷺ نوێژی دەكرد لە شەودا كاتێك دەیویست سوجدە ببات نەیدەتوانی؛ چونكە عائیشە لەبەردەمی پاڵ كەوتبوو و نووستبوو، بۆیە قاچەكانی دەگرت و بەرزی دەكردەوە ئینجا سوجدەی دەبرد، پاشان كاتێك هەڵدەستایەوە قاچەكانی دادەنایەوە، جا ژوورەكە بچووك بوو لەگەڵ ئەمەشدا دایكمان عائیشە دەڵێت زۆرێكم نەدەبیست لەوەی ئافرەتەكە دەیوت جا الله تعالى ئەمەی دابەزاند (**قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا**) ئەمە دینەكەمانە و ئەمەش ڕێكخەرەكانمانە، وە ئەوەش دیموكراسی و ئازادی ڕادەربڕینە، بۆیە لێرەوە تێدەگەم بۆچی دەیانەوێت دیموكراسی هەبێت، وە بۆچی دەیانەوێت ئازادی ڕادەربڕین هەبێت؛ چونكە هیچ هۆكارێك لەبەردەمیان نیە بۆ لەناوبردنی ئەم دینە -كە گومانی خۆیانە- تەنها بەوە نەبێت موسڵمانان ناچار بكەن لەسەر دیموكراسی و ناچاریان بكەن لەسەر ئازادی ڕادەربڕین.

لێرەدا ئازادی كۆتایی هەیە إن شاء الله باسی دەكەین كە ئەویش ئازادی تاكەكەسییە، دێینە سەر ئازادی تاكەكەسی، ئەم بەڵایەی سێیەم چییە؟!

ئازادی تاكەكەسی: واتە ئینسان هەرچی بوێت بیكات و لێپرسینەوەی لەگەڵ نەكرێت لە لایەن هیچ كەسێك، زۆر درێژە نادەم بە باسەكە تەنها كورتی دەكەمەوە لە نموونەیەك، ئایا دەزانی لە ئەمریكا پەنجا ملیۆن لادەری ڕەگەزیی هەیە! واتە ئەوانەی كاری گەلی لوط دەكەن، پەنجا ملیۆن لە سێ سەد و پەنجا ملیۆن، واتە حەوت یەكی گەلی ئەمریكی كاری گەلی لوط ئەنجام دەدەن، لە هەر حەوت كەسێك یەكێكیان ئەم كارە دەكات، ئەم كارەساتە لە كوێوە هات؟ لە ئازادی تاكەكەسی، جا ڕێگەیان دا بە پیاو هاوسەرگیری بكات لەگەڵ پیاو كە ئەمەش ئێستا لە قانونە ئەوڕوپیەكان ناسراوە بە "هاوسەرگیری هاوڕەگەزبازەكان" واتە هاوسەرگیری دەكات لەگەڵ پیاوێكی وەك خۆی، وە گرێبەست هەیە، وە نووسینەوە هەیە، وە هەندێك ڕێكخەر هەیە بۆ ڕێكخستنی ئەم كارە، چۆن؟ دەڵێت چونكە ئەمە لە

---

(١) المجادلة: ١.

ئازادی تاكەكەسییە، تۆ ناتوانیت ڕێگری لە كەسێك بكەیت لەوەی كارێك ئەنجام بدات لە جەستەی خۆی كە بەخۆی ڕەوا دەبینێت.

بۆیە لە وڵاتانی دیموكراسی ئەگەر موسڵمان لە ماڵەكەی دەربچێت بەرەو مزگەوت و ئافرەتانێكی پۆشاك لەبەری ڕووت ببینێت ناتوانێت هیچ بڵێت، ئازادی تاكەكەسییە، وە كەسانێك ببینێت لەسەر ڕێگا زینا دەكەن ناتوانێت هیچ بڵێت، ئەمە ئازادی تاكەكەسییە، وە كەسانێك ببینێت كاری گەلی لوط دەكەن ناتوانێت هیچ كارێك بكات، ئەوانە ئازادن، ئازادی تاكەكەسییە، وە ببینێت كەسانێك ئارەق دەخۆنەوە ناتوانێت هیچ بكات، ئەمە ئازادی تاكەكەسییە، وە ئەگەر بە دوورگەیەك تێبپەڕێت ناسرا بێت بە دوورگەی ڕووتەكان ئەوا ناتوانێت هیچ كارێك بكات چونكە ئەمە لە ئازادی تاكەكەسییە، لە وڵاتانی ئەوڕوپا، بەهۆی ئازادی تاكەكەسییەوە هەندێك دوورگە و شوێنی تایبەتیان هەیە ناسراوە بە "دوورگەی ڕووتەكان"، واتە پیاو و ئافرەت ناچنە ئەوێ تەنها دوای ئەوەی خۆیان ڕووت دەكەنەوە بەتەواوی! .

سەبارەت بە بابەتی گۆڕینەوەی هاوسەرەكان ئەمەش بە هەمان شێوە لە ئازادی تاكەكەسی دایە، پیاوەكە بێزار دەبێت لە هاوسەرەكەی بۆ ماوەیەك، ئینجا كێشەیەك نیە هاوسەرەكەی بدات بە فڵان و هاوسەری فڵان بخوازێت؛ چونكە ئەمە لە ئازادی تاكەكەسییە، جا لە كوێ ئیسلام دەگاتەوە بە دیموكراسی و ئیسلام لە كوێی ئەم كۆڵەكانەیە،

أقول قولي هذا وأستغفر الله لي ولكم وجزاكم الله خيراً.

**وەرگێڕانی و ئامادەكردنی**
**پێگەی ڕاستەڕێ**

